

# نواقض الاسلام

## هەڵوەشێنراوەکانی ئیسلام


نووسینی:

پێشەواو زانایی پایەبەرز:

محمدی کوڕی عبدالوهاب

ڕەحمەتی خودای لیبێت

ڕافەکردنی مامۆستا:

علی هەولیری فێرگە

بسم الله الرحمن الرحيم

إنَّ الحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ ونَسْتَعِينُهُ ونَسْتَغْفَرُهُ، ونَعوذُ باللهِ مِنْ شُرورِ أنْفُسِنا ومِنْ سَيِّئاتِ أعْمالِنا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلِ فَلا هادِيَ لَهُ. وأشْهَدُ أنْ لا الهَ إلا اللهُ وأشهَدُ أنَّ محمداً عَبدُهُ ورسُولُهُ. يا أيُّها الذينَ آمَنوا اتَّقُوا اللهَ حَقَّ تُقاتِهِ ولا تَمُوتُنَّ إلاّ وأنتُمْ مُسلِمونَ .

يا أيُّها النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ الذي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ واحِدةٍ وخَلَقَ مِنها زَوجَها وبَثَّ مِنهُما رِجَالاً كَثيراً ونِساءً واتَّقُوا اللهَ الذي تَساءَلُونَ بِهِ والارْحَامَ إنَّ اللهَ كانَ عليكُمْ رَقيباً.

يا أيُّها الذينَ آمنوا اتقوا اللهَ وقُولوا قَولاً سَديداً، يُصلِحْ لَكُمْ أعمالَكُمْ ويَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللهَ ورسولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوزاً عَظيماً..

أمَّا بعدُ: فإنَّ اصدَقَ الحَديثِ كِتابُ اللهِ، وخَيرَ الهَدِي هَدْيُ محمدٍ ﷺ، وشَرَّ الامُورِ مُحْدَثاتُها، وكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ وكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ،وكُلَّ ضَلالةٍ في النَّارِ

## پێشەکی

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدلله رب العالمين والصلاة والسلام على خاتم الأنبياء والمرسلين وصلى الله على محمد وعلى آله وصحبه اجمعين وبعد: خوێنەری بەرێز ؛بیرو باوەڕ وەکو سەر وایە بۆ لاشە ئەگەر نەبێت ئەوا ئەویش هیچ نرخێکی نابێت ،هەر بۆیە ش سەیر ئەکەین ئەبینین بانگەوازی هەموو پێغەمبەران (عليهم السلام ) لە (نوح) وە هەتا (محمد ) سلاوی خودایان لەسەر بێت'بریتی بووە؛ لە (توحيد) و یەك خودا پەرستی و ڕاست کردنەوەی بیرو باوەڕ ،ئەمە مەبەستی یەکەمی بانگەوازەکەیان بووە ،کەدەبێتە مایەی چاك بوونی دونیاو ڕۆژی دوای خەڵك، بۆیەخوشکی سەنگینم برای بەڕێزم؛ پێویستە بزانی کە خودای گەورە پێویستی کردووە لەسەر هەموو بەندەکانی موسڵمان ببن و دەست بگرن بەم ئیسلامە عەزیزەوە و ووریا بن لەوەی پێچەوانەی ئیسلامە، وە پێغەمبەری( صلى الله عليه وعلى اله وسلم) بۆ هەمان مەبەست ڕەوانە کردووە، خودای گەورە هەواڵی پێداوین کە هەر کەسی شوێنی ئەو پێغەمبەرە ئازیزە( صلى الله عليه وعلى اله وسلم) بکەوێ ئەوە هیدایەتی وەرگرتووە و هەرکەسێکیش پشتی لێ هەڵکا ئەوە گومڕابووەوڕۆچووە،، کەوابوو هەر کردارو گوفتارو بانگەوازێ لەسەر ئەم قاعیدەو بنچینەیە بنیات نەنرێ ،ئەوا بێگومان ئەبێتە مایەی لەنێو چوون و لادان وگومڕابوون لەڕاستە شەقامی ئیسلام (صراط المستقيم) ئەمە بنچینەو قاعیدەیەکی گەورەیە لەئیسلام ،هەرکاتێك خەڵکی لەهەر سەردەمێکدا لێ بێ ئاگابوون ئەوە ئەکەونە هەڵدێری شرك و بیدعەو دەرچوون ولادان لەئیسلام ،پەنا بەخودای گەورە ئەگرین ، بۆیە بەئەرکی سەرشانی خۆم زانی بەپێی توانا شەرح و لێکدانەوەی(نواقض الاسلام) هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام، کتێبە بەنرخەکەی زاناو پێشەوای پایەبەرز [محمدی کوڕی عبدالوهاب] 'ڕەحمەتی خودای لێبێت' بکەم بۆ ووریا کردنەوەی موسڵمانان و تووش نەبوون وڕزگار بوون لێیان. لەم کارە مەترسیدارانەی کە ئەبنە هەڵوەشێنەرەوەی ئیسلام،

خوێنەری بەڕێز؛ کەسەیری فەرمایشتەکانی خودای پەروەردگار ئەکەین ئەبینین لە چەندین ئایەتدا لە هۆکارەکانی پاشگەز بوونەوە و شیرك و کوفر ووریامان دەکات، هەروەها زانایان 'ڕەحمەتی خودایان لێ بێت' لە باسی حوکمی مورتەددا (هەڵگەڕاوە لە دین) باسیان کردووە کە موسڵمان بە چەندین هەڵوەشێنەرەوە لە ئیسلام دەردەچێ و ئەوانە خوێن و ماڵی حەڵاڵ دەکەن، وە ترسناك ترین و ئەوەی کە زۆر ڕوو بدات، لەوانە ئەم دە (10) خاڵەن: کە بەیارمەتی خودای پەروەردگار ئاماژەیان پێ لەکۆتایدا ئەڵێم ؛ ئەی خودای پەروەردگار لەهەڵە !ئەکەم ؟ لادان بم پارێزی و نیەتم پاك بکەیتەوە بۆئەوەی تەنها مەبەستم تۆبێت لەم کارو نووسین وڕاڤەکردنە،پاشان سوودی بۆ هەموو موسڵمانێك هەبێ ، خودایە ئەگەر لەشتێکدا ڕاستم کردبێت و پێکابێتم ئەوە پاداشت و ڕەحم و یارمەتی تۆیە، وەهەر تاوان هەڵیەکیشم کردبێت ئەوە لەخۆم و شەیتانەوەیە .خودایە لێم ببوری و لێم خۆش ببی.

ڕۆژی یەك شەمە

بەروار

29 شەعبانی 1437 کۆچی

بەرامبەر 2016/6/5 زاینی

براتان :عەلی هەولێری فێرگە

## هەڵوەشێنەری یەکەمیان

(هاوبەش پەیدا کردن لەپەرستنی خودای گەورە) ، خودای گەورە دەفەرموێ: (ان الله لا یغفر ان یشرك به ویغفر ما دون ذلك لمن یشاء) (النساء؛ 48) واتە: خودای گەورە هەرگیز لەوە خۆش نابێ کە هاوبەشی بۆ بریارٍ بدەی، بەڵام لە هەموو تاوانێکی تر خۆش دەبێ بۆ هەر کەسێ کە خۆی بیوێ. وەهەروەها ئەفەرموێ ( انه من یشرك بالله فقد حرم الله علیه الجنه وماواه النار و ما للضالمین من انصار) (المائده؛72) واتە: بێگومان هەرکەسێ هاوبەش بۆ خودا دابنێ خودا بەهەشتی لێ حەرام دەکات و جێگای هەمیشەیی دۆزەخ دەبێ، .موشریکەکان لەوێدا هیچ کەس نییە پاڵپشتیان بێ وسەریان بخات بەرێزان ؛جۆرەکانی هاوبەش دانان بۆ خودا زۆرن , پشت بەستن بەغەیری خودای پەروەردگارو شەخص پەرستی یان هاوبەش دانان بۆ خودا وەکو بانگ کردن و داوا کردن لە مردووەکان و داوای کۆمەکی و نەزر و سەر برِن بۆیان ، خودای گەورە دەفەرموێت: (ومن یدع و مع الله الها اخر لابرهان له به فانما حسابه عند ربه انه لایفلح الکافرون ) (المومنون:117).واتە: هەرکەسێك لەگەڵ خودا هاواربکاتە پەرستراوێکی تر؛ کەهیچ بەڵگەیەکی بە دەستەوە نیە لەسەر ئەم هاوارکردنە، ئەوا ئەو کەسەی کە لەگەڵ خودا هاواری کردە کەسانی تریش حیسابەکەی لای خودایە و خۆی موحاسەبەی دەکات، وە حیسابەکەیشی ئەوەیە کە سەرفراز نابێت چونکە کافرە. وە کە رِزگار و سەرفرازیش نەبوو ئەوا بە هیلاك چووە و جێگای دۆزەخە بە بەردەوامی، پەنا بە خودا.هەر یەکێکیش بمرێت و هاواری کردبێتە غەیری خوداو شەریکی بۆ دابنێت ئەوە دەچێتە ناو ئاگرەوە وەك پێغەمبەری خودا( صلى الله عليه وعلى له وسلم) فەرموویەتی: ( من مات وهو یدعو من دون الله نداً دخل النار) (صحیح البخاری (ج 14 / ص 472). پێشەوا الشنقیطی المفسر'رِەحمەتی خودای لێبێت' لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا فەرموویەتی: (قد بين أن حسابه الذي عند ربه، لافلاح له فيه بقوله بعد (انه لایفح الکافرون) وأعظم

الكافرين كفراهو من يدعو مع الله إلها آخر... ونفي الفلاح عنه يدل على هلاكه وأنه من أهل النار، وقد حذرنا الله من دعاء إله معه في آيات كثيره...) تفسير (أضواء البيان في إيضاح القرآن بالقرآن).
کەواتە: لەم ئایەتە قورئانیە دەرکەوت کە هاوار کردنە غەیری خودا کوفرەو گەورەترینی کافران ئەو کەسەیە هاوار دەکاتە غەیری خودا لەگەڵ خودا، ڕوون وئاشکراشە عەلمانیەکانی کوردستان شەخص پەرستیان هەیە وخۆشیان دەوێن بە زەلیلیەوە، وە بە گەورە دەسەڵاتیان دادەنێن و پشتیان پێ دەبەستن.وە لێیان دەترسن بۆنموونە پارتیەکان ناوێرن درەختی وشك بووی شکاوی سەر قەبری مەلا مستەفاش دەستکاری بکەن !! یان هەندێك ئیعتیقادیان نەك هەر بە خودی شێخیك هەیە بە تەنها، بەڵکو بە بەردو دارو پەڕۆی سەر قەبرەکەشی هەیەو، بە پیرۆزی دەزانن و، بە گەورەی دەزانن و، بڕوایان وایە لە نەخۆشی چاکیان دەکاتەوەو، لە بەڵا دەیان پارێزێت و، خێرو بەرەکەتیان تووش دەکات !!. وە سوێند بەخودا دەخۆن بە درۆ، بەبێ ترس و شەرم، بەڵام ناوێرن ئاوا سوێند بە سەری شێخ یان سەرۆك حیزبەکانیان بخۆن!!. شەرم لە سەرۆك حیزبەکان یان شێخ زیاتر دەکەن وەك لەخودا.فەرمانی سەرۆك حیزب و شێخ لە پێشترە لایان لە فەرمانی خودا !!.پەنا بەخودا زۆرکیش لە خەڵکی بە نەزانی هاوار دەکەن و دەڵێن:(یا محمد، یا غەوس یا شیخ فلان هاوار ! ) لەوانەش یان سەربڕینی ئاژەڵ بۆ غەیری خودا یان هاوار کردنە غەیری خودا و پشت بەستن بەغەیری خودای پەروەردگار.کەواتە لە ڕاستیدا بیرباوەڕی دڵیان بە پەرستراوو ئیلاهیان دەزانن، ئەگەر خۆشتان وا نەزانن و بە دەمیش وانەڵێن. وە زانیشمان کە بیروباوەر حیسابە. لەکۆتایدا ؛دەڵێم زۆر زۆربەداخەوە نەفام و بێ ئاگایان ناگەڕێنەوە بۆلای سەرچاوەی ئیسلامەتی کە قورئان و حەدیسەو ناچنە خزمەتیان بۆ تێگەیشتن لێیان (تدبر) و ئیش کردن پێیان. بەڵکو بەشیان لە قورئان خوێندن تەنها بۆ مردووانە لەسەر تەعزیە، نەك بۆ زیندووەکان. وە ئەگەر بێت و لە کتابی نوسەرێکی باوەڕ پێکراوی خۆیاندا نوسرابێت دروستە هاوار

بکرێتە پیاوچاکان، ئەوە باوەڕ بەو دەکەن، بەڵام باوەڕ بە کەلامی خودا ناکەن، وە قورئان و حەدیس دەخەنە پشت گوێ و، مانای ئایەتەکانی دەگۆڕن و تەحریفی دەکەن بەناوی تەفسیرو لێکدانەوەو تەئویل و مەجاز.ئائەوانەن هەڵوەشێنەرەکانی ئیسلام

---

## هەڵوەشێنەری دووهەم

بەپشتیوانی خودای گەورە لە بابەتی ڕابردودا شەرحی خاڵی یەکەمان کرد (هاوبەش پەیدا کردن لەپەرستنی خودای گەورە) . بەیارمەتی خودای گەورە ئەچینە سەر خاڵی دووهەم ئەویش : (هەر کەسێك لە نێوان خۆی و خوادا واستە گەلێك یان ناوەند دابنێ و لێیان بپارێتەوە و داوای شەفاعەت و تکایان لێ بکات و پشتیان پێ ببەستێ و ئەوە بە کۆڕای دەنگی زانایان لە ئیسلام چووەتە دەرەوە بێباوەڕبووە.) بەڕێزان ئەم دیاردەیەش بەرچاوە ئاشکرایە لەنێو کۆمەڵگەدا ئەگوزەرێ ؟ وەکو ئە وەی کەسیك بچێت لە قەبرێك یاخود لەمەرقەدو شێخێك بپارێتەوە ،بڵێت ئێمە بەهۆی ئەوانەوە لەخودای گەورە نزیك ئەبینەوە وەکو کافرەکانی مەککە ئەوانیش کەپتەکانیان ئەپەرست بە بۆچوونی خۆیان وایان ئەزانی پێی لەخودا نزیك ئەبوونەوە ؟! بەڕێزان : خودای پەروەردگار ئەفەرمووێ : (ادعونی استجب لکم) (غافر'60) واتە: لێم بپاڕێنەوە وەڵامتان ئەدەمەوە .نەیفەرمووە بپاڕێنەوە واستە بکەن لەڕێگای فڵانە کەس . چونکە کەس هیچی بەدەست نی یەو سوودو زیان تەنها بەدەست خودایە. وەفریشتەو پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) و

پیاوچاکان، هێنانی قازانج و لادانی زەرەریان بەدەست نی یە، نەبۆخۆیان وە نەبۆ غەیری خۆشیان. وە ئەگەر هاواریشیان بکرێتێ هاواری کەس نابیستن، بۆیە ئەبێ زۆر چاك بیزانین هاوارکردنە غەیری خودا شیرکە، وە لە دونیادا واسیتەکردن بە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) و پیاوچاکان بۆ نزیك کردنەوەو شەفاعەت بۆ کردن لای خودا، دوای مردنیان کوفرەو، خودا لەم کارە ڕازی نی یەو فەرمانی لەسەر نی یە. چونکە کە هاواری هەر یەکێك بکەن جگە لە خودا، ئەوە هاوارەکە بەقسەی شەیتانەو نەتیجەشی هەر بۆ شەیتانە. وەك خودای گەورە دەفەرموێت:( إن یدعون من دونە إلا إناثا وإن یدعون إلا شیطانا مریدا )( النساء :117) واتە ؛ هاواریان بۆ غەیری خودا بۆ کەس نی یە، تەنها بۆ شەیتانێکی یاخی بوو نەبێت. خودای گەورە ئەفەرمووێ: ( ویعبدون من دون الله ما لا یضرهم ولا ینفعهم ویقولون هولاء شفعاونا عند الله ) (یونس '18) واتە: جگە لەخودا ئەپەرستن لەکاتێکدا کەوا ئەو پەرستراوانە ناتوانن هیچ زیانیان لێ دوورخەنەوەو هیچ سوودیان پێ بگەینن وە دەشلێن ئەوانە تکا کارمانن لای خودا ، سەبارەت (بە واسیتە دانان - الواسطة) زۆرکەس هەیە پێیان وایە واسیتە هەیە لە نێوان خۆیان و دەسەڵات دارو کاربەدەستان، بەهەمان شێوەش بۆلای خودا،ئەڵێن پێویستمان بە واسیتە هەیەو ئێمە داوا لەم واسیتانە دەکەین کە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) و پیاوچاکانن ( دوای مردنیان ) و ئەوانیش داوا لە خودا دەکەن هیدایەتمان بدات و ڕزق و بەختەوەریمان پێ ببەخشێت و ناڕەحەتی و زەرەرو ناخۆشیمان لەسەر لاببات و سەرمان بخات؛ چونکە ئەم واسیتانە لە خودا نزیکن و وا جوانترە ئێمە ڕاستەوخۆ داوا لە خودا نەکەین و داواکەمان لە ڕێگای واسیتەکانەوە بێت؛ چونکە داوای ئەوان بۆ ئێمە باشترە لە داوای ڕاستەوخۆی خۆمان. پەنا بەخودای گەورە ئەگرین ... ئائەمەیە هەڵوەشێنەرەوەی ئیسلام

بێ باوەڕبوون ، وەڵامی ئەم گومڕاییە ئەوەیە؟!! ئەم جۆرە بیروباوەڕو بۆچوونە سەرچاوەکەی زۆر تاوانێکی گەورەو ترسناکە چونکە لەوەوە سەری هەڵداوە کە پەنا بەخودا تەشبیهی خودای پەروەردگار کراوە بە دەسەڵات دارێکی دروست کراوی خاك بەسەر. واتە خودای پەروەردگار چوێنراوە (شبە) بە بەندەی دروستکراو. وە ئەم وپێچواندن و تەشبیەکردنەش لەلایەکەوە شیرك بڕیاردانە بۆ خوداو، هاوشێوەو هاوەڵ دانانە بۆخودای پەروەردگار ؛ کە وەك کاربەدەستێك بڕوایان پێی بێت، واتە چۆن پێویستی بە واسیتە هەیە بۆلای کاربەدەستێکی مورتەدو زاڵمی وەکوحوکامی عەرەب وپارتی ویەکێتی بێ ئاگا وبێ دەسەڵات، بەهەمان شێوەش وابزانرێت پێویست بە واسیتە دەکات بۆلای خودای (عادل) (بە ئاگای) (بەدەسەڵات) سەبارەت بە (شەفاعەتیش) زۆرێك گومڕابوونە و دەڵێن: هەموو موسڵمانێك باوەڕی وایە کە پێغەمبەر (صلی الله علیە وعلی الەو سلم )و پیاوچاکان شەفاعەت دەکەن بۆ موسڵمانان لە ڕۆژی قیامەتدا. کەوابوو ئێمە هەر لە دونیادا بەزوویی داوای ئەو شەفاعەتەیان لێ دەکەین کە خودا پێی بەخشیون. وە دەڵێین ئەی پێغەمبەری خودا (صلی الله علیە وعلی الەو سلم )شەفاعەتمان بۆ بکە لای خودا. وە ئەی شێخ عبدالقادری گەیلانی شەفاعەتمان بۆ بکە لای خودا. چونکە هەروەکو لە قیامەتدا داوای شەفاعەت و بەفریاکەوتنیان لێ دەکەین، بە هەمان شێوەش دروستە لە دوای مردنیشیان هەر داوایان لێ بکەین !. ڕەدی ئەم گومڕاییە ش ئەوەیە ؟! بەڵێ ڕاستە پێغەمبەری خودا(صلی الله علیە وعلی الە وسلم) شەفاعەت دەکات، وە هەروەها پیاوچاکانیش و، فریشتەکانیش و، شەهیدانیش شەفاعەت دەکەن، بەڵام دوای ئەوەی خودای گەورە ڕێگایان پێ دەدات، لەو سنوورەدا کە بۆیانی دادەنێت، بۆ ئەو کەسە شەفاعەت بکەن کە تەنها خودا پەرست (موحد) بووەو،

هـاوبەشـــی بۆ خودا پەیـدا نەکردووەو، هـاواری نەکردۆتە غەیری خودا. جـا بێ ئەوەی ئێمەش داوایـان لێ بکەین شـــەفـاعەتمـان بۆ بکەن، خـودا ڕێگـای شـــەفـاعەت کـردنی پێ داون. بەڵام لەگەڵ ئەوەشـــدا حەرامیشـی کردووە کە ئێمە لە دونیا داوای شـــەفاعەت کردنیـان لێ بکەین و هـاواریـان بکەینێ دوای مردنیـان. لـەخودای گەورە داواکارم بمان پارێزێ لە هۆکارەکانی پاشگەز بوونەوە و شیرك و کوفر،

## هەلوەشێنەری سێیەم

هەرکەسێك موشریکەکان هاوبەش دانەران بە کافرو بێ باوەڕ نەزانێ یان گومانی بێ لە کافر بوونیان وڕێچکەو ڕێبازەکەیان بە ڕاست ودروست لە قەڵەم بدات و بزانێ ئەوە کافر دەبێ بەڕێزان ؛پێویستە لەسەرمان ئێمەی موسڵمان ووریا بین و بیزانین هەرکەسێ کە خودا و پێغەمبەری خودا (صلی الله علیه وعلی اله وسلم) بەکافرو بێ باوەڕیان دانا ئێمەش بێ هیچ شك وگومان و لێکدانەوەیەك ئەبێ بەکافرو بی باوەڕیان بزانین، خودای پەروەردگار هاوبەش دانەرەکانی بەبێ باوەڕ داناوە ئەوانەی کە غەیری خودایان ئەپەرست ،جگە لەوانەش جولەکەو خاچ پەرستان و ئاگر پەرست و فریشتە پەرستاران و خۆرو مانگ وئاینەکانی تر .....ئەمانە هەموو موسڵمانان لەسەریان کۆڕان لەسەر کافر بوونیان ، تەکفیر کردنیان حەتمیە و واجبە لەسەر موسڵمانان ،زانایان فەرموویانە ( من لم یکفر المشرکین او شك فی کفرهم او صحح مذهبهم فقد کفر) هەروەکو کە خودای پەروەردگار ئەفەرمووێ (لقد کفر الذین قالوا ان الله هو المسیح ابن مریم ) (المائدە '17) واتە' بێ گوومان لە وانەی گوتیان خودا خۆی عیسای کوڕی مەریەمە لەودا جێی بۆتەوە بێ باوەڕو کافرن ، بۆیە پێویستە لەسەرمان کە بەدڵ باوەڕی تەواومان هەبێ کە ئەوانە بێ باوەڕن و کافرن بەرامبەر بە دینی ئیسلام ، ئەمەش هەڵەوەشێنەرەوەیەکی ترەو لە ئیسلام دەرچوونە ، خوێن و ماڵی حەڵاڵ دەبێ ئەوکەسە ...ئەمە بۆکەسێکە کە تەنها گومانی لەکافربوونیان هەبێ !! واوەیلا و هاوار بەحاڵی ئەوکەسەی کەبۆتە کەواسووری پێش سووپای کوفرو بەرگریشیان لێ ئەکات ؟؟؟

## هەڵوەشێنەری چوارەم

هەرکەسێ باوەڕی وابێ کە ڕێنمووی ورێو شوێن ورێبازی یەکێکی تر جگە لە ڕێبازی پێغەمبەری خودا (صلی الله علیه وعلی اله وسلم ) تەواو ترە یان حوکمی یەکێکی تر لە حوکمی ئەو باشترە وەکو ئەوانەی حوکمی (طاغوت)ەکان لە حوکمی پێغەمبەر (صلی الله علیه وعلی اله وسلم) بەچاکتر دەزانن ئەوەش کافر دەبێ بەڕێزان ' هەرکەسێك وابزانی غەیری دینی ئیسلام و ڕێبازەکەی پێغەمبەری خودا(صلی الله علیه وعلی اله وسلم) ئاین ورێبازێکی تر باشتر هەیە یان شوێن مەنهەج و ڕێبازێکی تر بکەوێت کافر دەبێ . هەروەکو کە خودای پەروەردگار ئەفەرمووێ (ومن یبتغ غیر الاسلام دینا فلن یقبل منه وهو فی الاخره من الخاسرین) (ال عمران؛ 85) واتە؛ جا ئەوەی بێ جگە لەئاینی ئیسلام پەیرەوی هەر ئاینێکی تر بکات لێی وەرناگیرێت ،لەقیامەتیشدا لە خەسارەت مەندو زەرەر مەندانە ، بۆیە هەر یەکێك گوێڕایەڵی کەسێك بکات وەك گوێڕایەڵی کردنی خودا، واتە ئیعتیقادیشی وابێت کە ئەوکەسەی گوێڕایەڵی بۆ دەکرێت شایستەی ئەوەیە فەرماندەر بێت و یاساو شەرع دابنێت و گوێڕایەڵی بکرێت؛ ئەوە ئەوکەسەی کردووە بەشەریکی خودا ، لە ئیعتیقادی پەروەردگاریشدا و لە گوێڕایەڵی و عیباتەتیشدا. خودای پەروەردگار لە قورئاندا بۆمانی ڕوون کردۆتەوە کە گوێڕایەڵی غەیری خودا لە بەحەرام دانانی حەڵاڵێك، یا بەحەڵاڵ دانانی حەرامێك شیرکە، وە شەریك دانانە بۆ خودا لەشەریعەت داناندا،، خودای پەروەردگار ئەفەرمووێ؛(وان اطعتموهم انکم لمشرکون)(الأنعام:121). واتە؛ ئەگەر ئێوە گوێڕایەڵیتان کردبان لە حەرام کردنی حەڵاڵ و حەڵاڵ کردنی حەرامدا، ئەوە ئەوانتان کردون بەشەریکی خودا لەمافی شەریعەت داناندا.وەهەورەها ئەفەرمووێ '(ومن لم یحکم بما انزل الله فاولئك هم الکافرون) (المائدة:44) واتە؛ جا ئەوەی حوکم و داوەری بەو بەرنامەیە نەکات

که خودا دایبەزاندووە، ئائەوانە بێ باوەڕن. وەهەروەها ئەفەرموێ:(ام لهم شركاء شرعوا لهم من الذين ما لم ياذن به الله )(الشورى: من الآية21)..واتە؛ ئایا ئیعتیقادیان بەچەند شەریك و هاوەڵێکە بۆ خودا شەرعیان بۆ دانابن کە ئیزن و ڕوخسەتی پەروەردگاری لەسەر نیە ؟! کەواتە؛ پێویستە مرۆڤ ئیعتیقادی وابێت کە تەنها پەروەردگاری دروست کاری بونەوەر مافی یاساو شەرع دانانی هەیەو شایستەی ئەوەیە (ألا له الخلق والأمر)،، وە غەیری ئەو کەس شایستەی شەرع دانانی نیە هەتاوەکو پێغەمبەریش کە نێردراوی خودایە( صلى الله عليه وعلى اله سلم ) خودای پەروەردگار پێی دەفەرموێ: (وان احكم بينهم بما انزل الله )(المائده'49) واتە' حوکم بکە لەنێوان خەڵکیدا بەو شەرع و یاسایەی کە خودا ناردویەتییە خوارەوە. بۆیە پێغەمبەریش (صلى الله عليه وعلى اله وسلم )دەیفەرموو:( ان اتبع الا ما يوحى الى انى اخاف ان عصيت ربى عذاب يوم عظيم) (يونس: 15).واتە من شوێن هیچ شەرعێك ناکەوم تەنها ئەوە نەبێت کە بەوەحی بۆم دادەبەزێ. پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وعلى اله وسلم) فەرموویەتی؛ (فان خير الحدث كتاب الله .وخير الهدى هدى محمد) اخرجه المسلم .واتە ؛ باشترین وتەو قسە وتەو قسەی خودای پەروەردگارە .وە باشترین ڕێنمووی ڕێنموی پێغەمبەری خودایە (صلى الله عليه وعلى اله وسلم) وە ئەو کەسانەش کە بیدعە ئەکەن لەدیندا ئەوانیش ئەگرێتەوە کەوا شوێن غەیری ڕێبازی پێغەمبەر کەوتوون (صلى الله عليه وعلى اله وسلم) بۆیە زۆر پویستە خۆمان لە بیدعەو شتی داهێنراو بپارێزین ، پێغەمبەری خودا ئاگاداری کردوینەتەوە( صلى الله عليه وعلى اله وسلم) کە فەرموویەتی: ((من أحدث في أمرنا هذا ما ليس منه فهو رد) (رواه البخاري ومسلم)،واتە: هەر کەسێك شتێك داهێنێت لەم ئاینەی ئێمەدا نەبێت، ئەوا بەڕووی خاوەنەکەیدا ڕەت دەکرێتەوە.ئەم مەرجەیە دەبێ لە هەموو کردەوەیەکماندا هەبێ، چونکە ئەگەر وانەبێ کردەوەکە بە ڕووماندا دەدرێتەوە و خەسارەت .مەندی دونیا و دوارۆژیش دەبین خودا پەنامان بدات

ئەبێ ئەوەش بزانین کە ئەو کەسەی باوەڕی وابێ ئەو ڕسا و یاسایانەی دروست کراوی دەستی مرۆڤن لە شەریعەتی ئیسلام باشترە ئەمەش دەچێتە ژێرئەم خاڵەوە، یان بیروباوەری وابێ ئیسلام لە سەدەی بیستەمدا بە کەڵکی تەتبیق و پەیڕەو کردن نایەت، یان ئیسلام هۆکار بووە لە دواکەوتنی موسڵمانان، یان ئیسلام لە پەیوەندی نێوان مرۆڤ و خودا دەرناچێ بۆ شتانی تر لە کاروباری ئەم ژیان، هەروەها ئەو کەسەی باوەڕی وابێ دەست بڕینی دز لە سزای دزی کردندا و ڕەجم کردنی پیاوی زیناکار و ژنی زیناکار کەژن و مێردیان هەبێ لە گەڵ ئەم سەردەمەدا ناگونجێ، هەروەها هەر کەسێ باوەڕی وابێ کە حوکم کردن بە جگە لە شەریعەتی ئیسلام دروستە با باوەڕشی وانەبێ کە ئەوە لە ئیسلام باشترە، چونکە لە بەر ئەوەی حوکم کردن بە جگە لە ئیسلام بە دروست دەزانێ، هەروەکو محمد مورسی گووتی ؛ سزای دەست بڕین نیە لەئیسلامدا؟ یان محمد غەزالی کە یەکێکە لە سەرکردەکانی ئیخوان فەرمودە ڕەت ئەکاتەوە و ئەڵێ بەکەڵکی ئێستا نایەت؟ بۆیە ئەوانە وحیزبە ئیسلامیەکان ئەگرێتەوە و ئەچنە ژێر باڵی ئەم خاڵەوە جونکە ئەوانە کە لە جیاتی ئەوەی سەدێکی بەربەست بن بۆ کوفر، گەرچی ئەبینین خۆیان بونەتە جسرو پردێك کە کوفرو عەلمانیەتیان بەسەردا پەڕیوەتەوە بۆ ناو موسوسڵمانان، چونکە خەڵکی جاران مۆسیقاو تێکەڵ بوونی ژن وپیاویان بە حەڵاڵ نەدەزانی تاوەکو ئیسلامیەکان بۆیان حەڵاڵ نەکردن، وە کە حەڵاڵ کرا ئەو کاتە بۆ دەبێت مۆسیقای ئیسلامیەکان وتێکەڵاویان حەڵاڵ بێت، بەڵام مۆسیقاو تێکەڵاوی بۆ عەلمانیەکان حەڕام بێت؟! کەواتە: ئەوان خەڵکیان ڕاکێشا بۆ عەلمانیەت لەم بابەتە،وە هەروەها زۆرێکیان بە عەمەلی ڕیش تاشینیان حەڵاڵ کرد بۆ خەڵکی، وە هەر ئەوانن بەگری لە زۆرێك لە موبتەدیع وبیدعە دەکەن!! کەوابوو حەرامێك کە کۆڕای زانایانی لە سەرە حەڵاڵیان کردووە ، کەوابوو هەر کەسێ حەرامێك (کە لە ئیسلامدا زانراوبێ) حەڵاڵ بکات،ئەیگرێتەوە ئەم خاڵە هەرکەسێك پشتیوانی لەکافران بکات وزینا و خواردنەوەی مەشروب و حوکم

کردن بە غەیری ئیسلام بەحەڵاڵ بزانێ ئەوە کافرە بە کۆڕای موسڵمانان، پەنا بە خودا دەگرین لەو شتانەی دەبنە مایەی تورە بوونی خوداو هەڵوەشێنەرەوەی ئیسلام ، وە پەنای پێ دەگرین لە سزای سەختی،،

## هەڵوەشێنەری پێنجەم

هەرکەسێ رقی بێ لە شتێك یان شتێکی پێ ناخۆش بێت لەوەی پێغەمبەر( صلى الله عليه وعلى اله وسلم ) پێی هاتووە ئەگەر کردەوەشی پێ بکات ئەوە بێ باوەڕەو کافر بووە، بە بەڵگەی ئەم ئایەتە' کە خودای گەورە ئەفەرمووێ ( ذلك بانهم كرهوا ما انزل الله فاحبط اعمالهم) (محمد'9).واتە: کردەوەی کافرەکان پووچەڵا بووەتەوە لە بەر ئەوی کە رقیان بووە لەوەی کە خودای گەورە دایبەزاندووە.قورئان بێ یان کتێبەکانی تر.بەو هۆیەوە کردەوەکانی ، .پوچەڵ کردنەوە و لێی وەرنەگرتن بەڕێزان: لێرە بۆمان دەردەکەوێت کە هەرکەسێك ڕقی لە هەر سوونەتێکی پێغەمبەری خودا بێت (صلى الله عليه وعلى اله وسلم) ئەچێتە ژێر باڵی ئەم خاڵەوە چا فەرموودە ڕەت بکاتەوە وەکو ئەم گومڕایانەی ناویان لەخۆیان ناوە (القرانين) ...یان ئەوەی ڕقی لە

سیواك كردن بێت یان شەرواڵی كورت یان ڕیش هێشتنەوە یان هتد... كەلە هەرفەرموودەیەك كە بە صەحیح و چەسپاوی پێمان گەیشتووە ..جونكە پێغەمبەری خودا هیچ شتێكی لەخۆیەوە نەهیناوە و نەگووتوە بەڵكو هەمووی وەحی بووە لەلایەن خودای پەروەردگارەوە بۆی دابەزیوە . هەروەكو كە خودای گەورە ئەفەرمووی (وما ینطق عن الهوی ان هو الا وحی یوحی ) (النجم' 3-4) واتە؛ قسەو گوفتاری ئەو پێغەمبەرە(صلی الله علیه وعلی اله وسلم) لەهەواو ئارەزوی خۆیەوە نیە بەڵكو ئەوەی كە ڕایدەگەینێت وەحی و نیگای خودایە ،گوێڕایەڵی كردنی پێغەمبەری خۆشەویستمان (صلی الله علیه وعلی اله وسلم) لەهەموو شتێكدا كە فەرمانمان پێ دەكات. بێگومان گوێڕایەڵی كردنی پێغەمبەری خۆشەویستمان (صلی الله علیه وعلی اله وسلم )شتێكی پێویستەو مەجالی سەرپێچی كردنی تێدا نییە. لەبەر ئەوەی خودای پەروەردگار فەرمانی پێكردوین كە گوێڕایەڵی فەرمایشتە جوانەكانی پێغەمبەری خۆشەویستمان (صلی الله علیه وعلی اله وسلم )بكەین و سەرپێچی نەكەین.خودای گەورە دەفەرمووێت: (یا ایها الذین امنوا اطیعوا الله واطیعوا الرسول ) (النساء'59)واتە: ئەی ئەو كەسانەی كە باوەڕتان هێناوە و باوەڕدارن گوێڕایەڵی خودا و پێغەمبەری خودا (صلی الله علیه وعلی اله وسلم) بكەن و لە فەرمانیان دەرمەچن. ئەم ئایەتە پیرۆزە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە گوێڕایەڵی كردنی پێغەمبەری خودا لەسەر ئەوەی كە گوێڕایەڵی كردنی پێغەمبەری خۆشەویست (صلی الله علیه وعلی اله وسلم )گوێڕایەڵی كردنی خودای پەروەردگارە، وەك لە ئایەتێكی تردا خودای گەورە دەفەرمووێت: (من یطع الرسول فقد اطاع الله )(النساء'10) واتە: ئەو كەسەی گوێڕایەڵی پێغەمبەری خودا (صلی الله علیه وعلی اله وسلم )بكات ئەوە بێگومان گوێڕایەڵی خودای پەروەردگاری كردووە. ئەم ئایەتە پیرۆزە ڕەدێكی زۆر گەورەیە بۆ سەر ئەو كەسانەی كە جیاوازی دەخەنە

نێوان قورئان و فەرموودە ڕاست(صحیح)ەکان بەوەی کە قورئانی پیرۆز وەردەگرن و فەرموودەکان لەبیردەکەن و فەرامۆشیان دەکەن و جێ بەجێیان ناکەن و گرنگیان پێ نادەن و شوێن کەوتنی فەرموودەکان بەلایانەوە واجب نییە، بێگومان ئەم جۆرە کەسانە گومڕاو سەرلێ شێواون وئەچنە ژێر باڵی ئەم خاڵەوە وهیچ ڕێزێکیان نییە لای پەروەردگار، چونکە ڕێزی فەرموودەکان ناگرن، بەم گومڕایانە دەوترێت (القرانیین) بۆیە بەڕێزان' نابێت هیچ شتێکمان پێ ناخۆش بێت ولا قورس بێت کە پێغەمبەری ئازیزمان هیناوێتی ( صلی الله علیه وعلی اله وسلم) ئەبێ ئاینی ئیسلامان هەمووی قبوڵ بێت وەکو خۆی نەوەك هەندێکی وەربگرین و هەندێکی پشت گوێ بخەین، ئەبێ بیزانین کەوا لەسەرپێچی کردنیدا ئاگری دۆزەخ هەیە! وە لە گوێڕایەڵی کردنشیدا بەختەوەری و مسۆگەر کردنی بەهەشت هەیە.. هەروەکو پێغەمبەری خودا ( صلی الله علیه وعلی اله وسلم) فەرموویەتی ؛ (كل أمتي يدخلون الجنة إلا من أبى. قيل: ومن يأبى يارسول الله ﷺ ؟ قال من أطاعني دخل الجنة ومن عصاني فقد أبى) (البخاري: 6851). واتە: هەموو ئوممەتەکەم دەچێتە بەهەشتەوە تەنها ئەو کەسانە نەبێت کەپشت هەڵدەکەن و مل کەچ ناکەن، گووترا ئەی پێغەمبەری خودا( صلی الله علیه وعلی اله وسلم )کێ هەیە پشت هەڵ بکاو مل کەچ نەکات؟ فەرمووی: هەرکەسێك گوێڕایەڵی من بکات دەچێتە بەهەشتەوە، وەهەرکەسێك سەرپێچی لەفەرمانەکانمدا بکات ئەوە پشتی هەڵکردووەو ناچێتە بەهەشتەوە وە لەسەرپێچی کردنیدا ئاگری دۆزەخ هەیە

## هەڵوەشێنەری شەشەم

هەر کەسێ گاڵتە بە شتێك لە ئاینی پێغەمبەری خودا(صلی الله علیە وعلی الە وسلم )یان لە پاداشت و تۆڵەی خودا بکات ئەوە کافر دەبێ، بەڵگەش ئەم ئایتەیە کە خودای گەورە دەفەرموێ: (قل اباالله وایاتەورسولە کنتم تستهزئون لا تعتدروا قدکفرتم بعد ایمانکم ) (التوبة:65. 66) .واتە: پێیان بڵێ ' ئایا گاڵتە و لاقرتێ بە خودا و ئایتەکانی و پێغەمبرکەی صلی الله علیە وعلی الە وسلم دەکەن ؟!! .پاساو مەهێننەوە لە دوای ئەوەی باوەڕتان هێنابوو کافر بوونەوە خوشك و برایانی خۆم .ئەبێ ئەوە بزانین هەرکەسێك گاڵتە بە بەدین بکات یان بەسونەتێکی پێغەمبەری خودا (صلی الله علیە وعلی الەوسلم) ئەوە تووشی بێ باوەڕی بووە،،یان وەکو ئەوەی گاڵتە بەڕۆژی دوای وسزای ناوگۆڕ بکات ،یاخود گاڵتە بەسوننەتەکانی پێغەمبەری خودا بکات،(صلی الله علیە وعلی الەوسلم) هەروەکو لەم سەردەمە ئەبینین هەندێك خەڵکی گومڕاو نەزان گاڵتە بەسوونەتەکان ئەکەن یان تانە لەدین ئەدەن بە گاڵتەو گەپ !!ئەوەی زۆر ئەبینرێ ڕۆژانە ئەوەیە کە خەڵکێك هەیە وەکو لە بابەتی ڕابردوو باسم کرد گاڵتە ئەکات بە (ڕیش هێشتنەوەو شەڕواڵی کورت و سواك گاڵتە کردن بەسیماو خۆپارێزی موسڵمانان) لەکاتێکدا هەموو ئەمانە چەندان فەرموودەی صەحیحیان لەسەرهاتووە ،ئەبێ ئەوەش بزانین ! هیچ جیاوازییەك نییە لە نێوان کەسێکدا بە گاڵتە بیان کات یان بە ئەنقەست یان لە ترساندا ،،تەنها کەسێك نەبێت کە زۆری لێ بکرێت.

## هەڵوەشێنەری حەوتەم

جادووگەر (السحر) لەوانەش ژن وپیاو لەیەك كردن و ژن وپیاو لەلای یەك خۆشەویست كردن ،یان فاڵ گرتنەوەو بەخت گرتنەوە و نوشتە كردن .هەركەسێك ئەنجامی بدات و پیی ڕازی بێت ئەوا دەر دەچێ لە ئیسلام و كافرە ).

یەكەم ' (الصرف) واتە' كارێكی جادووگەریە بەمەبەستی گۆڕانی دڵی ئینسان ئەنجام ئەدرێت لەوەی خۆشی دەوێت وەكو گۆڕینی كەسێك لە خۆشەویستی خێزانەكەیەوە بۆ ڕق لێ بوونی.، وە نزیك كردنەوەی دڵی دوكەس و دروست كردنی خۆشەویستی لەنێوانیاندا

دووهەم' (العطف) واتە'كارێكی جادووگەریە بە مەبەستی خۆشەویست كردنی شت ئەنجام ئەدرێت كە خۆی خۆشی ناوێت بە چەندین ڕێگای ناشەرعی.

بۆیە هەركەسێك جادو بكات پێی ڕازی بێت ویان بچێتە لای فاڵچی ساحیرو جادوگەر بەختی بگرێتەوە یان نوشتەیەكی بۆ بكات .ئەوە كافر دەبێت بە بەڵگەی ئەم فەرموودانە پێغەمبەری خودا(صلی الله علیە وعلی الە وسلم) فەرموویەتی ' (من اتی عرافا او كاهنا ، فصدقە بما یقول ، فقد كفرە بما انزل علی محمد ) (صحیح رواە احمد والحاكم ) ، واتە؛ هەركەسێك بچێت بۆلای شوێن هەڵگرێك، یاخود ساحیرو فاڵچیەك قسەكانی بەارست بزانێت ئەوە كافر ئەبێت بە و قورئانەی كە دابەزیوە بۆسەر محمد(صلی الله علیە وعلی الە وسلم) وەهەروەها فەرموویەتی '

من أتی عَرافا فسالە عن شيء لَم تقبل لە صلاة أربعین ) یوما)(صحیح مسلم رقم: (2230).واتە' هەركەسێك بچێتە لای فاڵچیەك و پرسیاری لێ بكات ئەوا چل ڕۆژ نوێژی لێ وەرناگیرێت.وەهەروەها فەرموویەتی ؛ (لیس منا من سحر أو سحر لە، أو تكهن أو تكهن لە، أو تطیر أو تطیر لە)(سلسلة الأحادیث الصحیحة رقم: (2650).واتە؛ ئەو كەسە لە ئێمە نی یە كەوا سیحر

دەكات یان بۆی دەكەن، یان فاڵچیەتی دەكات یان بۆی دەكەن، یان بەخت دەگرێتەوە یان بۆی دەگرنەوە..(ئەوە ئەســتێرەكانی بەختیش ئەگرێتەوە ئەمەش كرداری فالچیەتی و كرداری ســەردەمی نەفامیە ،كەئەوەش هاوەڵ بڕیار دانە بۆ خودای پەروەردگار و باوەڕبوون و زانینی غـەیبـە ، پەنا بەخودای پەروەردگار ئەمەش كوفرە.جونكە جگە لەخودای گەورە كەس غەیب نازانێ ، ئەوانەی بەناوی ( كاهن ،عراف ،النجم) بۆ هەرسێ جۆریان واتەی هاوبەشــیان هەیە كە گوایە داهاتو بۆ مرۆڤ ئاشـكرا ئەكەن بەبینینی ئەسـتێرەكان ، بۆیە ئەمەش كوفرە باوەڕبوون پێی لەئیســلام دەرچوونە ووریا بن) پەنا ئەگرین بەخودای گەورە ئەم دیاردانەش لەنێو میللەتی ئێمە زۆرە خەڵكێك هەیە باوەڕی پێیەتی و ئەخوێنێتەوە!! یان خەڵكێك هەیە باوەڕی بەجادوو هەیە خەڵكێك هەیە كە شــتێكی لی ئەدزرێ یان وون ئەبێ ئەڕۆوا بۆ لای فاڵچی و جادو تا بۆی بدۆزێتەوە خەلكی وا هەیە متمانەی تەواوبە فاڵچیەكە ئەكات كە هەندێ درۆ دەلەســەو ناونیشــانی پێ ئەڵێ تا وای لێ دێت ئەبێ بە تاوان باركردنی خەلكێكی بی تاوان ئەبێ بە فرتەنەو حەقدو شەڕ، بۆیە ئەبی بیزانین هەركەسێ جـادوو گەری ئەنجـام بـدات یـان پێی ڕازی بێـت ئەوە كـافر دەبێ لـەئیســلام دەردەچێ ،، بەڵگەش ئەم ئـایەتەیە كە خودای گـەورە دەفەرموێ:( واتبعوا ما تتلوا الشـياطين على ملك سـليمان وما كفر سليمان ولكن الشياطين كفروا يعلمون الناس السحر وما أنزل على الملكين ببابل هاروت وماروت وما يعلمان من أحد حتى يقولا إنما نحن فتنة فلا تكفر فيتعلمون منهما ما يفرقون به بين المرء وزوجه وما هم بضــارين به من أحد إلا بإذن الله ويتعلمون ما يضــرهم ولا ينفعهم ولقد علموا لمن اشــتراه ما له في الآخرة من خلاق ولبئس ما شـروا به أنفسـهم لو كانوا يعلمون ) (البقرة: 102) واتە'بێباوەڕەكان شـوێنی ئەوە كەوتن كە شـەیتانەكان دەیانخوێندەوە بە سـەر موكی (سلیمان)دا و (سلیمان) كوفری نەكرد بەڵكو شـەیتانەكان كوفریان كرد كەوا خەڵكیان فێری سیحر (جادوو) دەكرد و ئەوەی كە دابەزیە سـەر دوو فریشـتەكە لە (بابل) (هاروت و ماروت) و ئەو دووانە هیچ

کەسـێکیـان فیری سـیحر نەدەکرد تـاوەکو نەیـانگوتـایە ئێمە تـاقیکردنەوەین بۆیە کوفر مەکە، ئەوانیش فێری ئەوە دەبوون لێیـانەوە کەوا نێوان ژن و مێردیـان پێ جیـا دەکردەوە، وە ئەوانە ناتوانن بە سـیحر زیان بە هیچ کەسـێك بگەیەنن ئیللا بە ڕێپێدانی خودا نەبێت، وە شـتـانێك فێر دەبوون کە زیـانی پێدەگەیـاندن و سوودی بۆیان نەبوو، وە بەڕاستی دەشیانزانی هەر کەسێك سیحر بکرێت و فێری ببێت ئەوا لە ڕۆژی دوایـیدا هیچ بەشـێکی نییە، وە بەڕاسـتی بە خراپترین شـت خۆیـان فرۆشـتوە ئەگەر بزانن.
بۆیە زۆر وریابن سیحر و جادوو کوفرە و ساحریش کافرە

## هەڵوەشێنەری هەشتەم

(پشـتگیری و پشـتیوانی کردن و یارمەتی دانی موشـریکەکان لە دژی موسـڵمانـان،) هـەرکەسـێك ئەمە بکات ئەوە کافرەولەئیسـلام ...دەرئـەچـێـت و خـوێـن و مـاڵـی حـەڵاڵ دەبـێـت بەڵگەش ئەم ئایەتەیە کە دەفەرموێ( ومن یتولهم منکم فانه منهم ان اللە لا یهـدی الـقـوم الضـالمـیـن ) المـائـده؛51) واتـە ؛ هەرکەسـێکیشـتان دۆسـتایەتیان لەگەڵ بکات و بیان کات بە یارمەتی دەرو دۆسـتی خۆی وە یان هاوکاری وهاوڕێیەتیان بکات بێ گومـان ئـەوکـەسـە هـەر لـەوانـەو بـەوان دائـەنرێ ،ئـەگـەرچی بەناسـنامەش موسـڵمان بێت بێ گومان خودا هیدایەت وڕێنمایی گەلی ناحەق و سـتەم کار ناکات ، دەبینین هەندێك لەم سـەردەمە زۆر بەئاشـکرا بوونەتە کەواسـووری پێش سـوپای کوفر بۆ دژایەتی ئەهلی تەوحید نەوەك هەر بە ووتە بەڵکو ئامادەش بوون ئەگەر چەکیان بدەنێ بچنە بەرەی کوفر بۆ کوشتنی ئەهلی توحید ..خودای گەورە لەوە زیاتر ڕیسـوایان بکات.لەکاتێکدا ئیسـلام ڕێگەی نەداوە تـەنـانـەت پیرۆزبای لـەکافران بکرێ لـە چـەژنـەکانیـان ئـەمچا وەر تۆ بڕۆیی تەحالوف بکەی یەک بگری لەگەڵیان بۆ کوشـتنی براکەت ! ئـەمـەیـە دەرچوون لـەئیسـلام ، وەهـەورەهـا خـودای پـەروەردگار ئـەفـەرمووی (لا یتخـذ المؤمنون الکـافرین أولیـاء من دون المؤمنین ومن یفعل ذلك فلیس من اللە في شيء) (آل‌عمران :28) واتە ؛ نابێت ئیمانداران، کافران بکەنە پشت و پەناو یارو یاوەری خۆیان لەجیاتی ئیمانداران، ئەوەی کاری وا بکات، ئەوکارەی دەبێتە هۆی ئەوەی هیچ پەیوەندییەکی ئیمـانیی بەخـوداوە نـەمێنێت، هـاوەڵی ئازیزعوبـادە ی کوڕی صـامت 'ڕەزای خودای لێبێت' یەکێك بوو لەهاوەڵانی بەدر کاتێ پێغەمبەری خودا(صـلی اللە علیه وعلی الە وسـلم) بۆ جەنگی خەندەق خۆی ئامادە کرد ،نسبەیان کەم بوو پێوستیان بەهاوکاری کردن هەبوو عوبادە هاتەلای پێغەمبەری خودا(صلی اللە علیه وعلی

اله وسـلم) گووتی؛ ئەی پێغەمبەری خودا(صـلی الله علیه وعلی اله وسلم) من پێنج سەد کەس جوولەکەی برادەرم هەیە، مۆڵەتم بدە با بچم لەگەڵ خۆم بیانهێنم بۆ ئەم جەنگە ، و هاوکاریمان بکەن ، خودای پەروەردگار ئەم ئایەتەی دابەزاند کە نابێت ئیمانداران، کافران بکەنە پشـت و پەناو یارو یاوەری خۆیان لەجیاتی ئیمانداران،ئەمە لەکاتێك کە یارمەتی موسـڵمانان بکەن ، جا وەرە تۆ بیان هیێنی هاوکاریت بکەن بۆ موسـڵمان کوشـتن !! ئەی خاك بـــــــــــــەســــــــــــــەرتـــــــــــــان ،

یان هەندێکی تر ئەبینین لاسای کافرو بی باوەڕان ئەکاتەوە خۆشیان ئەوێن ،وەکو هەندێك یاریزانە کافرەکانی تۆپی پێی خۆش ئەوێت و لاســایان ئەکاتەوە لە قژو لە جلو بەرگ ، ئەمەش ئەبێ بزانن هەمووی ئەچێتە ژێر ئەم خالەوە ، پێغەمبەری خودا (صـلی الله علیه وعلی اله وسلم) فەرموویەتی (المرء مع من احب) صحیح سنن ابی داود، واتە' کێت خۆش بوێت لەگەل ئەودا حەشـر ئەکرێی .هەورەها لەفەرموودەیەکی تردا فەرموویەتی ؛ هەرکەسـێك خۆی بەقەوم و گەلێك بچوێنێ ئەوە لەوانە ، دەی ئەتانەوێ لەگەڵ کێ حەشـر بکرێن، لەگەڵ پێغەمبەری خودا (صـلی الله علیه وعلی اله وسلم ) وهاوەڵانی ئازیز 'ڕەزای خودایان لێبێت' یان لەگەڵ کافرو بێ باوەڕان هەڵبژێرە؟

## هەڵوەشێنەری نۆهەم

هەرکەسـێ بیروبـاوەڕی وابێ کەســـانێك هەن مەودایـان هەیە و ڕێگایان پێدراوە کە لە شـەریعەت وئاینی ئیسـلام دەر بچن و پەیڕەوی نەکەن ئەوە کافر دەبێـت،(ئـەوعـەقڵانیـە گـەمژەو بێ عـەقڵانـەی کەزۆر موشـتاق و تامەزرۆی دیموکراسـیەتن و لەپێناوی ئەجەنگن و ئەیانەوێت متربەی بکەن لەگەڵ ئیسـلام ڕێك ئەچنە ژێر باڵی ئەم خاڵەوە .بەبەڵگەی ئەم ئایەتە کە خودای گەورە دەفەرموێ:(ومن يبتغ غير الاسـلام دينا فلن يقبل منه وهو فى الاخره من الخاسـرين ) (ال عمران ؛ 85) واتە: هەرکەسـێ جگە لە ئیسـلام ئـاینێکی تر هەڵبژێرێت لێی وەرناگیرێت، وە لە ڕۆژی دوابیدا لە خەسارەتمەندانە، ئەو ئاینەی کە خودای گەورە قبوڵیەتی و پێی ڕازیە تەنها ئیسلامە و ئاینەکانی تر نـابێـت کاریـان پێ بکرێت، وهـەروەهـا خودای گـەورە دەفـەرمووێ (ان الـذين عنـدالله الاســلام ) (ال عمران ؛19) واتە: .بەڕاســـتی ئـایـن لە لای خـودا بـریـتـیـە لە ئـیـســـلام کـەواتـە ؛هەموو ئـاینەکانی تر جگە لە ئیسـلام وەکو ئـاینی گاور و جولەکە و بوزی وزەردەشـــت و ئاگرپەرســـت و... هتد لای خودای گەورە قبوڵ نیە و ڕەت کراوەیە و ئەو کەســـانەش لەســـەر ئەو ئاینانەن و ئەوکەســـانـەش کە بیرو باوەڕیان وایە مەودا هـەیـەو ئەوکەســـانە ڕێگا پێ دراون ئەوە بێباوەڕن وکافرن خەســـارەتمەندی .دونـــــــــــــــــیـــــــــــــــــــاودوارۆژن

.یەکەم: ئەو ئـاین و بیروباوەڕەی کە هەڵی بژاردووە لێی وەرنـاگیرێت

دووهەم: کەســـەکەش لە زیانمەند و خەســارۆتمەندەکانی دونیا و دوارۆژە و کردەوەکانی قبوڵ نیە، چونکە هەر کردەوەیەك بۆ ئەوەی !وەربگیرێت پێویســتەئەم، ســێ مەرجـەی خوارەوی تێدا بێـت:؟

یەکەم؛ ئەو کەسەی کردەوەکە ئەنجام دەدات یەکخواپەرست بێت

.و هاوەڵ بۆ خودای گەورە بڕیار نەدات
دووهەم؛ دەبێت کردەوەکە بە نیەت پاکیەوە تەنها بۆ خودای گەورە .ئەنجامی بدات
سێهەم؛ ئەو کردەوەیەی کە دەیکات دەبێت بە پێی قورئان و .سوننەت بێت
ئەگەر هەریەکێك لەم مەرجانە نەبێت کردەوەکە قبوڵ ناکرێت، ئاشکراشە ئەوانەی موسڵمان نین ئەگەر چی مەرجی دووەمیشیان تێدا بێت بەڵام بە دڵنیاییەوە مەرجی یەکەم و سێیەمیان تێدا نیە .بۆیە هیچ کردەوەیەکیان قبوڵ نیە و دەدرێتەوە بە ڕویاندا
بۆیە بەڕێزان ؛ ئەو ئاینەی کە خودای گەورە قبوڵیەتی و پێی ڕازییە تەنها ئیسلامە و ئاینەکانی تر نابێت کاریان پێ بکرێت،ئەوانەی کە ئاینی ئیسلامیان پێ قبوڵ نیە و بانگەواز بۆ ئاینەکانی تر دەکەن کافرن وتەنها ماندوبوون و سەرشۆڕیشیان بۆ دەمێنێتەوە.. چونکە خودای گەورە بڕیاری داوەو موژدەی بەموسڵمانان داوە کە دەبێت ئاینی ئیسلام و موسڵمانان سەربخات لە دونیادا وە لە دوارۆژیشدا بەهەشت تەنها بۆ موسڵمانانە ئەوانی تر بەهەشتیان لەسەر قەدەغە کراوە، بۆیە کاتێك دەبینیت جولەکەو گاورەکان (ڕاستر وایە بوترێت: (گاورەکان) یان (خاچ پەرستان) نەك مەسیحیەکان چونکە ئەوانە شوێنکەوتەی هەوا و ئارەزووی خۆیانن نەك شوێنکەوتەی عیسا ــ علیه السلام ) ئەو هەموو پارە خەیاڵیە لە پێناو دژایەتی ئایندا خەرج دەکەن بێئومێد مەبە و مەڵێ تازە ئیسلام لەناوچوو !! چونکە:(ان نصر الله قریب) واتە: بە دڵنیاییەوە سەرکەوتنی خودا زۆر نزیکە.داهاتووی گەش و پرشنگدار و ئاسۆی ڕوون و سەرکەوتنی مسۆگەر چاوەڕوانتانە ئەی موسڵمانان دڵنیابن ،، بۆیە هەوڵ بدەن و تێبکۆشن و بگەڕێنەوە بۆ قورئان و سوننەت بە تێگەیشتنی پێشینە چاکەکانتان

## هەڵوەشێنەری دەیەم

(پشت کردن لەئاینی خودا بەجۆرێ نەفێر بێ نەکاری پێ بکات )

بەڵگەش ئەم ئایەتەیە کە خودای گەورە دەفەرموێ:(ومن اظلم ممن ذكر بايات ربه ثم اعرض عنها انا من المجرمين منتقمون) (السجده '22) واتە: کێ هەیە لەو کەسە ستەمکار تر بێت کە ئایەتەکانی خودای بۆ ڕوون بکرێتەوە لە پاش ئەوەش پشت هەڵا بکات بەڕاستی ئێمە تۆڵە لە تاوانباران دەسێنێتەوە.

بەکۆڕای یەک دەنگی زانایان کەسێك بە کافردادەنرێت ئەگەر هاتوو ئیمانی بە بەشێك لە دینی پیغەمبەر( صلى الله عليه وعلى اله وسلم) نەبێت، ئەدی چۆن کەسێك کافر نابێت کە ئیمانی بە بنچینەو بناغەی دینی ئیسلام نەبێت و پشت لەدینی خودا هەڵبکات و نەفێری بێ و نەکاریشی پێ بکات !! بەدڵنیایەوە ئەوکەسە بێ باوەڕەو کافرە ،وەکو زۆرێك ئەبینین لەم زەمانە کە خۆیان پێ موسڵمانە بەڵام پشتیان لەئاینی خودا کردووە ئەمانەش ئەبنە دووبەشەوە چۆری یەکەمیان :هەندێکیان زانیاریان پێ یە بەڵام لەترسان خۆیان شاردۆتەوەو جورئەتیان نیە فەرموودەیەك شەرح بکەن بۆئەوەی جێگای گەرم ونەرمیان لێ تێك نەچێ ، باوەڕ بوون هەر ئەوە نیە بەمۆنی وسەرشۆڕی بژی هەر بەدەم بڵێی موسڵمانم و باوەڕدارم ، باوەڕ بوون واتە؛ بەڕاست زانینی ئەو ئاینەی کە پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وعلى اله وسلم) پێی هاتووە لە گەڵ قەبوڵ کردن و ملکەچ بووندا بەرگری کردن لەم ئیسلامە عەزیزە ، نەك تەنها بەڕاست زانین وتەواو پاشان پشتی تێ بکەی ، (أبو طالب)ی مامی پێغەمبەر (صلى الله عليه وعلى اله وسلم) باوەڕدار نەبوو بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وعلى اله وسلم) لە گەڵ بەڕاست زانینی ئەو ئاینەش کە پێی هاتبوو،لەگەڵ بەرگری کردنیشی لەپێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وعلى اله وسلم) لە گەڵ شایەتی دانیشی بەوەی کەوا باشترینی ئاینەکانە ئەم ئیسلامە .ئەمچا هەربەکافری و بەبێ باوەڕیش مرد جونکە باوەڕدار نەبوو پشتی لێ هەڵکردو نەفێری بوو

نەکاری پێ کرد، کەواتە باوەڕ بوون هەر ئەوە نیە تۆ ئیسلام بەڕاست بزانی بە باشترینی ئاینەکانی بزانی بەڵام پشتی لێ هەڵبکەی و نەفێری بی و نەکاری پێ بکەی چۆری دووهەمیان هەر پشتیان لەئاینی خودایەو ناشیانەوێ هیچ لە بارەی ئیسلامەوە شارەزا بن و بیزانن ، ئەمەش بێگومان ئەچنە ژێر باڵی ئەم خاڵەوە ، وەهەروەها ئەوانەش کە تەنانەت بە ووتەش بەرگری لەم ئیسلامە عەزیزە ناکەن ، بێگومانیش هەموو زانست زانیاریەك دوای قورئان بۆش وبەتاڵ وپوچە هەروەکو پێشەوا شافعي 'ڕەحمەتی خودای لێبێت' فەرموویەتی: (کل العلم سوی القران مشغله إلا الحديث وإلا الفقه في الدين **العلم ما كان فيه قال حدثنا وما سوى ذاك وسواس الشياطين).واتە: هەموو زانستەکان جگە لە قورئان خۆخەریك کردنە.. تەنها فەرموودە و تێگەیشتن و شارەزا بوون لە دین نەبێت.زانست ئەوەیە کە تێیدا بوترێت پێغەمبەر (صلى الله عليه وعلى اله وسلم) فەرموویەتی و جگە لەمەش هەمووی وەسوەسەی شەیتانە.

خوشك وبرایانی خۆم ؛ ئەم (10 )خاڵەی کە باسکران هیچ جیاوازییەك نییە لە نێوان کەسێکدا بە گاڵتە بیان کات یان بە ئەنقەست یان لە ترساندا تەنها کەسێك نەبێت کە زۆری لێ بکرێت.
ئەم (10) دە خاڵە زۆر مەترسیان لێدەکرێت و زۆریش ڕوو دەدەن لەم سەردە مە .جا پێویستە مرۆڤی موسڵمان خۆی لێیان بپارێزێت و ترسی لەوە هەبێت نەوەکو تێبکەوێت.بۆیە هەر کەسێ باوەڕی وابێ کە حوکم کردن بە جگە لە شەریعەتی ئیسلام دروستە با باوەڕشی وانەبێ کە ئەوە لە ئیسلام باشترە، چونکە لە بەر ئەوەی حوکم کردن بە جگە لە ئیسلام بە دروست دەزانێ ئەوە کافرەو بێ باوەڕە ،، یان هەرکەسێ حەرامێك کە کۆڕای زانایانی لە سەرە حەڵاڵی کردووە کەوابوو هەر کەسێ حەرامێك (کە لە ئیسلامدا زانراوبێ) حەڵاڵ بکات ، ئەوە کافرە بە کۆڕای موسڵمانان وە خوێنی حەڵاڵ دەبێت و دەکوژرێت و بە هەڵگەڕاوەش لە قەڵەم دەدرێت (مرتد). وە لە قەبرەستانی موسڵمانان نانێژرێت بەڵکو فرێ دەدرێتە چاڵێکەوەو

دادەپۆشرێت. پەنا بە خودا دەگرین لەو شتانەی دەبنە مایەی تورِە بوونی خودا، وە پەنای پێ دەگرین لە سزای سەختی.

وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين

وصلى الله على خير خلقه محمد وعلى آله وصحبه وسلم

مامۆستا:على هەولێری فێرگە